# انتشارات سیدیان مهاباد

# چاپەمەنی سەییدیان مەهاباد



نرخی حەوت تمەنە

[redacted]

پێشکەشبێ بە دایکم :
ئامینە عینایەتی .

# بنەچەکەی کوردان
# و
# بنچینەی زمانی کوردی



دانەر: تەوفیق وەهبی

وەرگێڕ: تاها فەیزی زادە .

پێشکەش بێ بۆ

هاوکاری خۆشەویست

کاک عبیداللە ئەیوبیان

[illegible]

١/٧/٦٥

« دەستنوسی مەکەنزی »

## « نـــــاوەرۆك »

به نێوی خـــــودا

«سەرەتا ، لە لایەن وەرگێڕەوە»:

هاوینی ئەوساڵ هاتبومەوە سابلاخ (= مەهاباد) ،بەڕێز عوبەیدوللای ئەیوبیان ناميلکەی :

**The origins of the Kurds and their language.**

**by:Col.T.Wahby.**

- کە ئێستێ وەرگێڕاوەی ئەو ناميلکەتان بەدەستەوەیـــە - دا مێ وتکای لێ کردم لە ئینگلیسییەوە ڕا وەریگێڕمە ســـەر زمانی کوردی.

بەڵام بەچەند هۆ ئەوکارەم پێ خۆش نەبو : ١- لەمێژە خەریکی کۆ کردنەوە و پێکەوەنانی هەمو مەبەستێکم کـــە لەمەڕ شێخی ســـەنمانـــەوە بەهەر زمانێك - خۆ ماڵـــی یان لاوەکی - نوسرابێ یان کوترابێ . جا ، دەمە ویســـت هەربەو کارەم ڕابگەم ودرێژەی پێ بدەم و هەمو ساتوکاتی خۆمی بۆ تەرخان بکەمو نەپڕژێمە سەر شتی دی .

پێم وابو : کردنی هەرکارێکی دی وەختگرە ، سەخڵەتی هێنە ، غافلێنەرە ، پەك خەرەو دەبێ لێی لادەم.

٢- لەلایەکی تریشەوە دەمدی : لەو ناميلکەدا دو کـەڵـە پیاوی ماقوڵ ، هەڵکەوتو ، نێوبەدەرەوە و چازان - بەڕێـــز تەوفیق وەهبی بەگو بەڕێز مـەکـەنزی **Mackenzie** -

واوێدەچێ پێکەوە بەدەمەقالێ زانستی هاتون وقسەیان ئەوتۆتێك گیراوە کەکەسێك دەتوانێ پێکیان بهێنێتـــەوە یان بەرپەوانی ولایەنگری یەکێکیان بکا ودەستی بۆیەکێکیـان لەملی بدا وبلێ:وەبالٌت بەئەستۆی منە ئەتۆ راستو دروست دەلێی وئەوی دی قسەکەی چەوتە ، کەکەلەپیا وێك بێ لەگوێن خۆیان یان چ بڕ لەئەوان کەمترنەبێ •

من دەمزانی کەلەڕێزەی ئەوان دا ، نیم وتەنانەت بـــە قامکێکی ئەوانیش نابم• کەوابو نابێ قەرەیان لە قەرەی بدەم• کورت وکرمانجی بلێین : خۆمبەدەرزێك دەها تـــــە پێش چاووئەوانم بەگاسن • دیارە ، بەهەزار دەرزیان ـ گاسنێکیان تێ نابێ ! بەلێ ، ئەوبەرێزەنا وبراوانەلەچاو من بەرز بەسەرن •

٣ـ هۆیەکەی دیکەی ئەوە بو: هەستم بەوەی دە کـــرد نامیلکەیەکی ئاوا پرمەبەست وگرینگ کەوێژەرونوسەرەکەیشی کورد بێ ، بێ گومان دەبێ وەرگێڕدرابێتەوە سەرزمـــانـی کوردی • جا ، بە نیازی وەدی هێنان یان وەدی نە هێنـــانی گومانەکەم چەند کتێبێکم خوێندەوە• شوێنم هەلگرت و ـ وەسۆراغی کەوتم تاکو لەسەرەتای بەرگی یەکەمی قاموســـی زمانی کوردی ، بەرهەمی مامۆستا زەبیحی ـ بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٤٤ ـ دیتم گۆڤارێك بە نێوی " ئەسلی[1]کوردوزمانیان "

ڕاگەیاندراوە کەلەلایەن ماموستا تەوفیق وەهبی بەگ و کۆڕی زانیاری کوردە لە بەغدا بڵاو کراوەتەوە. زۆرم ـ هەوڵ دا ئەو گۆڤارەی وەدەستخەم ، بۆئەوەی بزانم دەقی وی وەرگێڕاوەوەی ئەو نامیلکەیەکەوا ، لای منە یان شتێکی ترە. چو لێ بشارمەوە ، لەوماوەیەشدا ڕمودەی ناوەرۆکی نامیلکەکە ببوم. لەولایەشەوە گۆڤارەکەم لێ بوبە چێشتی تاسوغی ، هەر چێشکەشم نەکرد!

جا ، بۆ ئەوەی لەو خوتخوتەی ڕزگار بم وبەدڵنیایی ئەوەی : کە بێتو نامیلکەکە بەزمانی کوردیش وەرگێڕدرا ـ بێتەوە ، خاوەنی ئەو وشە لێکدانەوە وشی کردنەوەولەسەر ڕۆیشتنەی نییە ، دەستمدا قەڵەمێ وهەڵمکوتاسەر نامیلکە بۆ وەرگێڕانی بەزمانی کوردی . سێ لاپەڕەی دوایین نە بێ کە پڕبون لە وشەی ئەوێستایی ولەکاتی چاپکردن دا لێم دەبونە دلۆ ومێمڵ ، هەموم وەرگێڕاوە ، یان باشترە بڵێم: خۆم لەوەرگێڕانەوەی هەڵقوتاند. چونکو ، کردنی ئەو کارە لە ڕادەی ئەزمونی زانستی ودەسەڵاتی وێژەیی وشارەزایی زمانەوانی من ، بەدەربو.

من لێرەدا زۆربە پەلەولامی هەردوک براخۆشەویست و ـ زاناکانم ـ بەڕێز تەوفیق وەهبی بەگ وبەڕێز مەکەنزی ـ ئاوا دەدەمەوە : لام وایە لەباتی ئەوەی کە بنەڕەتی

لێکۆڵینەوەی بنەچەکەی کوردان لەسەربەرەبەیانی مێژووەدا بمەزرێنین و وردە وردە بەرەوژێربینەوەبۆلای سەروبەندی ئەو ڕۆژی کوردان ، باشترە بە پێچەوانە ، لێکۆڵینەوەکەمان لەسەربناخەی هەل ومەرجی ئەو ڕۆژی کوردان دا بنێین و بەزەبری ئەو هەمودەستکەوتەزانستیانەی کەلەچەرخی بیستومدا پاشەکەوتمان کردوون ، پشکنینەوەکەمان بۆ وچان ، بۆ لایەنگری وبۆ دەغەزداری بەرەو ژور درێژە پێ بدەین و سەرەو ژوربینەوەتاکودەگەینەبنەماڵەی هەرە کۆنی کورد. بەوچەشنەی ، کەرەستەوسەرچاوەو بەڵگەی باشی زۆرترمان بەدەستەوەیە ولەشتێکی دیاری وڕون وبەرچاو وساکارڕا دەچین ، بۆلای شتێکی تادیاری وتاریکوشاراوە و تێکەڵاو.

ئەوجا ربێینەوە سەرزمانی کوردی : ئێستێ لەهەرکتێبێک وجێوشوێنێکی دنیادا ، کوردی بەزمان ناسراوەنەک شێوە، کە لکێک بێ لە زمانێکی . دیارە لەبەر ئەوەش کەزمانە، بۆ خۆی زاراوەو ڕێنوس وڕێزمانێکی تایبەتی هەیەوهەموپێداویستێکی بۆئەوکەسانەی قسەیان پێ کردووە وپێی دەکەن ، پێک هێناوە وپێک دەهێنێ و وێڕای زمانەکانی دی وبەش بەحاڵی خۆی، خزمەتی بەتێگەیاندن وتێگەیشتن کردووەودەکا . کەوابو من وای بۆدەچم، نابێ ئێستێ باس ودمەتەقەو وت و ـ

وێژلەسەرئەوەی بکرێ کەزمانی کوردی سەروەچییە، یان دەچێتەوە سەر کوێ • ڕەسەنی یان ناڕەسەنی بەوەی نییە کە زمانی کوردی سەروەچ کۆمەڵگەیەکە، بەڵکو بەوەیەکەبۆ خۆی ولە باڵ خۆی دا چلۆنە؟هۆگانی هێزی وی بەربڵاوە، یان تەنگەبەرو کورتە؟ ئەگەربەربەرین ودرێژە، بێین یان و پۆرتر وبەر بلاّ وتری کەین • ئەگەر بەرتەسك وکورتە، خەمی لێ بخۆین وبۆی دەست بەکارودڵ بەیارە بین ولەو بارودۆخەی ڕزگاری کەین •

بەرلەوەی کە لەنوسینی ئەوسەرەتا یەببمەوە، ڕادە ـ گەیەنم: لەسەر هێندێك لەوشەکانی وەرگێڕاوەکەم ـ کە پێدا ویستیان بە شی کردنەوەهەبووە ـ ژمارە دانا وە وسەرلە بەر وبەدوای یەکدا، لە بەشی "لەسەر ڕۆیشتن" دا، شیم کردونەوە •

خوێنەری بەڕێزم، تۆش بەچاوێکی ڕەخنەگرە بڕوانە دەقی وەرگێڕاوەکەم • هاتو سوچێکت بەرچاوکەوت وپوچێکت تێدا ـ دیتەوە، پێم بڵێ • تاکوشتێکت لێ فێربم ودوعا بۆعومرومالّت بکەم • من بە تێ ڕادیوی دەتوانم بڵێم: ئەوەی لەبارا نم داهەبووە، بۆم وەدەر خستوی وئەوەی لەدەستم هاتووە، بۆم کردوی • تۆش ئەو ئاڵە کۆکەپرچنە ی، بە دیاری لەمنی شوانەوێڵە، وەرگرە وبەسەرمدا مەدەوە! دیارە، دیاری شوانی

ئاڵـە کۆکـە .

سپاس بۆ بەڕێــز سەیید عوبەیدوڵلا ئەییوبیان کە، هانیدام بۆ وەرگێڕانی ئەو نامیلکەیە، لە زمانی ئینگلیسییەوە ڕا بۆســەر زمانی کوردی .

سپاس بۆ بەڕێز سەیید موحەممەد سەمەدی کە دەستنوسەـ کەی ، تێکۆشەرانەوبەدڵ ودا و بۆ " تایپ " کردمو لەوەدەر خستنی نێوەکانی دەقی وەرگێڕاوەکەی دا، هاوکاری کردم.
چاکەی ئەوانەم لە بیر ناچێ مخودا ڕاوەستاویان کا .

هاوینی ساڵی ١٣٦١ ـ تاها ـ فەیزی زادە

« بەرکولێك ەلەلایەن ڕێکخەرەوە: »

" هەرلێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ کورددا ، دەبێ لە سەر بناخەی ماد پێك بێ . ویلادیمیرمینۆرسکی (٢)".

لەڕۆژی ٢٢ دێسامبری ١٩٦٤ زاینی، تەوفیق وەهبی بەگ ماموستای فرەزانای کوردناس ، لەکۆری پسپۆرانی کوردناس دا بەوچەشنەی خوارەوە لەسەر کورد وزمانی کوردی ، دواوە.

دەبێ بەرچاوبخەین کەئەوماموستا بەرێزە لە سالی ١٩٣٠ زاینی دا ، کتێبی بەنرخی خۆی لەژێرنێوی " دەستوری زمانی کوردی " وەدەرخستووە . بەدوای ئەوەدا ، لەگەڵ ئێدمۆندس(٣) ، فەرهەنگۆکێکی بەدوزمانی کوردی وئینگلیسی پێکەوە ناوە وڕێکی خستووە کە، ڕێکخراوی ئاکسفۆرد بۆی بلاو کردونەتەوە.

کۆری کوردناسی

«دەقیوتاری بەڕێز تەوفیق وەهبی بەگ ؛۴

" ئەوڕۆ لە منیان خواستۆتەوە لەلای ئێوە کوردناسانی بەڕێزدا بم وبۆ خۆم مەبەستێکی گرینگ هەڵبژێرم ولەسەری بڕۆم ودەبێ ئەو مەبەستەش لەمەڕ کورد ناسی(٤) دا بێ ۰ جا ، لام وایە ئەگەر لەسەر بنەچەکەی کوردان و ـ بنچینەی زمانیان ، بڕۆم، باشتر وبەجێتر بێ ۰کەوا بو تکایە گوێم لێ بگرن :

مێژوناسەکانی ئیسلامی کەلەسەربنەچەکەی کوردان ڕۆیون ولێی دواون ، نوسراوەکانیان زۆرخەیالاویەوچ بۆنیەکی زانستیان لێ نایەوبە بەڵگەوسەرچاوەی باش ولەبار وبەر بڵاو ناناسرێن ۰ بەڵام لەوچاخانەی دوایی‌دا وبەتایبەت ئێستێکە، زاناتوروپایەکان کەلێک بە پوخت وپاراوی وباشی لەومەبەستەی دواون ولێیان کۆڵیوەتەوە۰ لەنێوئەوهەمو پشکنینانەوولێکۆڵینانەوەدا ، کارەلێهاتووهێژاکانی ویلا دیمیرمینۆرسکی ، سەرتۆپ ، دەست نیشان کراوودانستەیە۰

لەنامیلکەیەک دا (٥) کەلەسالی ١٩٣٨لەبروکسێل دەرچووە وبەرهەمی وتارەکانی بیستومین کۆنگرەی ڕۆژهەلات ناسانی تێدابووە ، چازانی هەلکەوتوەویلا دیمیرمینۆرسکی بەوچەشنەی سەبارەت بەکورد وزمانی کوردی ، دواوە: هەرلێکۆڵینەوەیەک لەمەڕ کوردوزمانی کوردی دا ، دەبێ لەسەربنەڕەتی ماد و ـ

زمانی مادی پێك بێ • بەڵگەش بۆ ئەولێ ڕوانینە و

تێ ڕوانینەی ، زۆرن و وەنەبێ دەستمان بە هەمو یان

ڕا نەگا • بەڵام هێندێك لە زاناکان ، ڕوانگەیان دژی ئەوەیە

دەڵێن : کوردومادپێکەوە پێوەندێکی ئەوتۆیان نییە •

منیش لەسەر ئەوباوەڕەم کەکوردوماد پێوەندێکی لە پسان

نەهاتویان پێکەوەهەیەوکورد وزمانی کوردی لەسەر پنجی

ماد وزمانی مادی ڕواوەو گوراوە• کەوابو ، بە پێویستی

دەزانم بۆ هەڵاویژکردن ورەخنەگرتنی ئەوزانایانەی دژی

ئەو ڕوانگەیان هەیە ، ولام ببینمەوەو ڕوانگەی خۆمیان

پێ بسەلمێنم•

ئەو زانایانەسەرچاوەوبەڵگەی باوەڕپێکراوی وەهایان

بەدەستەوە نییە کە بەرچاوبخا : کوردی ئەوڕۆ پشتاو پشت

وبەرەبەبەرە لەبەرەبابی مادانە نین • یەکێك لەو زانا

نێوبراوانە کە پێی وایە کورد وماد پێکەوە پێوەندیان

نییە ، دوکتور مەکەنزی(٦)یە •

مەکەنزی ناوەرۆکی ڕوانگەی خۆی ، لەساڵی ١٩٦١ لە

وتارێك دا بەرچاوخستووە وئەو وتارە لەلایەن ڕێکخراوی –

زمانناسێ وە بڵاو بووەتەوە• مەکەنزی لەو وتارەدا زمانی

کوردی لەگەل زمانەئێرانیەکان وفارسی پێکەوە بەراوەرد

دەکاو پێکیانەوە هەڵدەکێشێوهەڵیان دەسەنگێنێتا بزانێ

لەکوێ وە وەك یەك دەچن ولەکوێدا جیا وا زیا ن هەیە •

ئەو جورە بۆ چونە ولێك دا نەوەیە ، لەسەر بنەڕەتی ڕوا-نگەی تێ دێسکۆ Tedesco یە •

پێویستە بکوترێ ەتێ دێسکۆی ئا ڵما نی کتێبێکی وەدەر-ختووە بە نێوی : شێوە ناسی واتە : ڕێگا ی ناسینی ڕا ویژەکا ن • لەم کتێبە دا ، چەند ڕا ویژ کەلکی چەند زما نا نن ، لەگەڵ یەکدا پێك هەڵکێشرا ون وبەرا وە رد کرا ون • جا ، مەکەنزیش لەو ڕوا نگەیەوە چا ولەزما نی کوردی دەکا و پێی وا یە ، زما نی فا رسی نێونجی(٧) زۆرکا ری کردووەتەسەر زما نی کوردی • بە پێی ئەو بیروبا وەڕە ، -مەکەنزی ، بنچ وبنا وا نی زما نی کوردی لە سەر زما نە با شورە ڕۆژئا وا یەکا ن دا مەزرا ندووە ولە حاست بیروبا وەڕی مینۆرسکی سرۆنگە • بە پێچەوا نەی ئەمە ، مینۆرسکی بنا خەی زما نی کوردی ، زما نەبا کوریەڕۆژئا وا یەکا ن دەزا نێ ، هەر ئەو جێگا یا نەی کە لە پێشوش دا ، ما دەکا ن لێی دا نیشتوون •

هەروەها مەکەنزی لای وا یە ، کوردەکا نی ئەوڕۆ ، لەبەرەبا بی ما دەکا نەوە نەها تونەتەخوا رێ • مەکەنزی وەختێك ئەوبیرو -با وەڕەی خۆی دا دەڕێژێ ودەیڕا زێنێتەوە ، ئیدی بیرلەئا کا می قسەکەی خۆی نا کا تەوە • مەکەنزی ، ما مۆستا ی زما نی کوردییە لە : فێرگەی ڕا هێنەروپێگەێنەروفێرکەری زما نەکا نی سەروە -

رۆژهەڵات وئا فریقا ی لەندەنێ وبەزما نی کوردی شا رەزا یە٠ بەڵام لە سەر ئەوا نەش ڕا بەڵگەکا نی، بۆسەلما ندنی قسەی خۆی لەمەڕ مەبەستی سەرەوە، گرینگ وپا را ونین ٠ بەڵگەی بۆ سەلما ندنی قسەی خۆی کۆ وە کردون ، بەڵام لام وا یە - هیچ کا میا ن بۆ ئەوەی نا بن پشتیا ن پێوە ببەستین وبەدڵنیا ییەوە پەسندیا ن کەین وبەتێرا دیو ی با سیا ن کەین ٠

ئەوڕۆکە لێکۆڵینەوەوپشکنینەوەی زا نستی دەری خستووە کە کورد وما د پێوەندێکی بەرچا و وئا شکرا یا ن پێکەوەهەیە. بیروبا وەڕی مەکەنزی ولایەنگرا نی ڕوا نگەی وی دەمەترسێیە دەخا وخا وەنەکا نی ئەوبیروبا وەڕەی نەك هەربەسەردا ری زا نست دا هەڵناچن ونا گەنەسەرچلۆکی پێشکەوتن ، بەڵکوسەربەرەو - ژێریش دە بنەوە وبەهەردیش دا دەکەون ٠ دوکتۆر مەکەنزی ئا وا دەنوسێ : ما دەکا ن لە سا ڵی ٦١٢ پێش زا ینیدا بە گرتنی نینەوا ، هێزودەسەڵات ودەمودەزگا ی خۆیا ن پەرە پێدا وپا شایە تێکی گەورەوبەربڵاویا ن پێك هێنا ودا یا نمەزرا ند٠کوردەکا نی ئەوڕۆش بێ ئەوەی بەڵگەی با شیا ن بەدەستەوە بێ ، پێیا ن - خۆشە خۆیا ن سەربەئەوا ن بنا سێنن تا کو لەکا رەسا تەکا نی پڕ لەقا رەما نەتی ما دەکا ن خۆیا ن بەبەشدا رلەقەڵەم دەن ومێو- دا ی مێژووی خۆیا ن لە ٦١٢ پێش زا ینی ڕا بەدنیا ڕا بگەیێنن ٠

ئێمەلەولامدا دەڵێین : بەڵێ ، ئەوە هەرکوردەکـــان نین کـەلەسەر ئەوباوەڕەن ، بەڵکو ڕێکخراوە باوەڕپێ ـ کراوەکانی ئێرانیش هەردەستیان بۆلەملی دەدەنو واڕادە ـ گەیێنن. مەکەنزیش پاش لێکۆڵینەوەکەی خۆی پێوەندێکی لە نێوان کوردومادا دەبینێتەوە ، بەڵام ئەوپێوەندییە پتروەک تێکچڕژانێکی کەموکورِدەچێ تاکو تێکەڵاوێکی پتەو وقولَ. دەبێ بڵێین : بۆ ڕون کردنەوەی پێوەندی لە نێوان مادوکورددا پێدا ویستیمان بە زۆربەڵگەوسەرچاوەی چاك هەیە. دەنا ، بیروباوەڕی ئێمە زانا پەسندە بەنرخ ، هێژا ولەبارنابێ .

لە پێش هەموشتێك دا دەبێ لەخۆمان بپرسین : مادەکان چییان لێ بەسەرهاتووە؟ بەرەی پاش ماوەی ئەوبنەماڵەلە ـ مێژینەیە کێن؟ بە پێی نوسراوەکانی کزێنۆفۆن ـ بە نێوی پاشەکشەوتێك شکان ، کەوا رنرلە سالی ١٩٥٧ زاینی دا وەری ـ گێڕاوەتەوە ـ لەباکوری عێراقی ئەوڕۆوەبیگرە تالێوارەکانی بەرەو ڕۆژهەلاتی چۆمی فورات تاکو ئاخروئۆخری چەرخی پێنجومی پێش هاتنەسەردنیای عیسا ـ سلاوی خودای لێ بێ ـ مەڵبەندونا وچەی مادەکان بووە. بەڵام ئەونەتەوەیە لەسەر ئەو هێزوپێزەش راهەتا دوای چەرخی حەوتەمین ، بە باشی نەناسرابو. هێندێك سەرچاوەوبەڵگەی مێژوویی هەن کە بەر

چاودەخەن : لەدوای ساسانیەوە ڕا نیتوی مـادە گۆڕاوە بە مـای و مـاس. پاشانیش لەبەرەبەیانی دەسەڵاتـی ئیسلام دا ، ئەووشەیە بۆ تە: ماه. دە بینین ئەو وشانـە هەموریان نیتوی مەڵبەندانن . بە پێی ئەو بەڵگانەی کـە تارامیتکان بۆ ئیتمە یان بە جێ هێشتووە ، هەرلەمێژەو ەڕا تا دوای سەردەمی ساسانیەکان ، وشەی مـادای هـەربـە سەر زمانانەوە بووە و ئەو وشەووشەی مـەدە لە هەمـو وشەکان ڕەسەن ترن ، چونکو ڕەگەزوماکی مادان چاك تردەنو- یتنن .جا ، چ ڕوی داوە و چ قەوماوە کـەئەوخەڵکـەسەر بـە ئیمپراتورەیـە بە جارێك لەبیر چوبێتەوە وسەری تیتـدا چوبێ وپاشەبەرەشی ڕا نەگەیەندرابێ ؟ !

هەربـەوجورەی کـەلەسـەرەوە لێی دواین ، ئەونیتـەوە تاسەردەمـی ساسانیتکان ، لەسەرزاران بووە. بەڵام ئیتمـە نازانین لە دوای ئەو سـەردە مـەی ڕاچ شتێك بوبـە هـۆی ئەوەی کـە ئەو نیتوە شرت وگوم بێ و ببێتـە بەردی نیتـو گۆمـێ وتەنانەت بەسەر زارانیشـەوە نەمێنێ !

لاموایە ئەگەر نیتوی مادیش لەنێو نیتوان دا نەمابێ ، بێ گومان مادەکان هەرهەبون وبەژیانی خۆیان ، درێژەداوە. کەوابو پێموایە: ئەوکوردانەی کەئیتستێ کۆچەر وگـەڕۆک نین ، دەچنەوە سـەر مـادان ولەڕەچەڵەکی ئەوانن .

ئەوهۆزە بەهێزە هیندوئێرانیانەی کە پاشان لەگەڵ
هۆزە دراوسێکانی گەڕۆك و خێڵاتدا تێکەڵاویان ـ
پەیداکرد بوە هەرلە مێژەوەڕا مەڵبەندو ناوچەی مادە ـ
کانیان لەمەترسی خستبو. پۆلیبیوس Polybius مێژو ـ
نوسی یۆنانی (١٢٥ـ ٢٠٥ پێش زاینی) ، لە کتێبێکی خۆی
دا بە نێوی " مێژوی دنیا " دە نوسێ : پاش ئەوەی کە
ئەسکەندەر دەسەڵاتی وڵاتەکانی بەدەستەوە گرت ، لە هەمو
سنورەکانی نێوان وڵاتەکانی خۆی ودراوسێکانیان دا مەاری
دروستکردن تاکو هۆزە ڕانەهاتوونەماڵاوەکان نەتوانن
پەل ببزێون وبچنە مەڵبەندی یۆنانیەکان .

لەسەردەمی پاشایەتی کالی نیکوس Callinicus واتە
سلوکوس دوهەم (٢٢٦ـ ٢٤٦ پێش زاینی)دا ، ئەو هۆزوڕەوەندا ـ
نەی کە لە کێوان دا دەژیان ، وەها بەهێزودەسەڵات ببون
کە ، ببونە بەرهەڵستی یۆنانیەکان . بە چەشنێکی کە
یۆنانیەکان نەیان دەتوانی دەسەڵاتی خۆیانیان بەسەر دا
بسەپێنن . (تاریخ ایران باستان ، حسن پیرنیا ).

لەمەودای سەردەمی پاشایەتی سلوکیەدا ، هێزی ئاوەندی
قەت لە خۆی ڕانەدی مەڵبەندی ئەوڕەوەندو نیوەگەڕۆکانە
بەرپێوە ببا . بەڵام هەرلەوکاتەدا ، داب وڕێ وشوێنەناوخۆ و
خۆماڵیەکانی ئاغاکان ودەرەبەگەکان ، زۆربە هێزترو ڕیشەک

وپێك تردەی توانی دانیشتوانی مەڵبەندەکان بەرێـوە بەرێ وداخوازیەکانیان پێك بێنێ وبە پێدا ویستیەکانی خەڵك رابگا .

وەها بەرچاودەکەوێ لەسەردەمی پاشایەتی پارتەکانیش دا ، یاساو رێ وشوێنە خۆماڵیەکان زۆر باشترلە هێزی ناوەندی پارتی توانیبێتی مادەکیتویەکان بەرێوەبەرێ وپێداویستیەکانیان پێك بێنێ . هەرلەبەرئەوەش بو کە ئەردەشیری پاپەکان (٢٢٥-٢٤١ زاینی) زاڵ بون بەسەر مادانی بەگرینگترین ئامانجی خۆیدەزانی . تاکو بێ بەر هەڵست ، بتوانێ هێزێکی ناوەندی پێکەوەبنێ . لەوسەردەمەی داکە ئەردەشیری پاپەکانە ناوچەی پارتەکانی وەدەست دەخست کارنامەکی هەرتەخشیری پاپەکانیش رێك خست وبڵاوی کردەوە هەرلەوپەرتوکەنیوە مێژویی ونیوە چیرۆکییەی خۆی دا :بە ئاشکرایی وتێرا دیوی دونێوی مادوکوردی بەیەك نەتەوە دێنێتە بەرچاو ورا دەگەیەنێ . بەلانی کەمەوەتا چەرخی شەشومی زاینی،کورد ومادهەروەك یەك نەتەوە نێو براون .

لە جێیەك ، لە کتێبی کارنامەك دا کە بە زمانی پەهلەوی ( = فارسی نێونجی) نوسراوەولەلایەن ئەردەشیرەوە شی کراوەتەوە ، هەڵمەت وهێرش بۆسەرمادەکانەبەو چەشنەی راگەیاندراوە: " ئەردەشیری پاپەکان ، پاش کوشتنی ئەردە-

وا نی پێنجوم- پاشای پارتەکان - قۆشەنێکی قـــورس وگەورەی لەزا بول وە پێک هێنا و ڕۆیشت بۆ شەڕلەگـــەڵ کوردان Kurdân - پاشای مادەکان -" کارنامەک هەروە- ها ڕادەگـەیێنـێ : " مادەکان پێیان وابوکـە چونکولـــە بەرامبـەری قۆشەنی ئەردەشیردا تێک شکاون وپاشەکشـەیان کردووە ، ئیدی لە مەترسی ناکـەون • بەلام ئەردە شیـــر چوارهەزا رشـەڕکـەری پێکـەوەنا وخوت وغافلێ بەسەرکوردا نـی دادا وهەزارکـەسی لێ کوشتن وئەوەی مابوشنـەوەە یان بـە دیلی گرتن یان برینداری کـردن وتفاق ودا نەوێڵێکـــــی زۆری لە کوردان - پاشای مادەکان - وکورەکانی زەوت کرد"• لێرەش دا هەروا دەردەکـەوێ کـەئەردەشیرە کوردوما دی هەر بەیەک نەتەوە دەزانێ ونیێویان دەبا •

هەروەها لە مێژوی ئارامێکان ، لە چەرخی پێنجومـــدا وا ڕادەگـەیێندرێ کە: شاپوری یـەکـەم، پاشای ساسانی، لە هەوەڵ سالی پاشایەتی خۆی دا (٢٤٢زاینی) لە هەولێرە لەگەڵ مادەکیێویەکان شەڕێکـی قورسی کـردءجا ، ئەوما دە کیێویانە دەبێ هەر کورد بوبن •

لەنیێوبەلگـەوسەرچاوەکانی چەرخی چوارەمدا نیێوێکـــــم وەبەرچاوکـەوتووە کـە دەکرێ نیێوی مادی بێ ونیێوی کوردیش • ئەونیێوە کـۆڕکشێـد Kor-Kshêd دە• کۆڕکشێدلە سالـی ٣٧٣ داحاکمی هەولێربووە• دوایەء ئەونیێوە گەلا لەتـــــر

بووە و بووتــە خـﻪرخشێد Xvar̂ - Xshêd •بێتو

بە جوانی تێی بڕوانین ، لەوشەی ئەوێستایــــــــــــــــی

- hvare- Xshaetaرا ، گیراوە • واتە: " ڕۆژ ی

پڕشنگدار" دیسانیش X ڕێکتــرولەبارتر بووە وئەو ڕۆئەو

وشەیە لە شێوەی کرمانجی دا هەیە• ئەووشەلە فارسی نێو-

نجی دا بووەتە: خۆرشێد hvare-Xshaeta.Xor - shêd

لەپەهلەوی ساسانی دا ڕێكَ ولوس تربووەوبووەتە Xorshêt

ولەفارسی نوێ دا دیسان ڕێكَ وپێکتربووە و بووەتــــــــە:

- Xur shîd کـەوابوە بۆمان دەردەکـەوێ نیۆی ئـــە و

حاکمـە ، فارسی نیەو کوردی یە• ئەگەربڵێین : وەکـوردی

ئێستێکـەش ناچێ، کەوابێ مادیە• ئێستێ لە زمانی کوردی

داخـۆر Xor مـان ، هەیە•

هەروەها چەند وشەی دیکـەش کـەئارا مینەن کەلــــــەو

دوا یدا نەدا دینرا ونەوەوناسراون کـە بێستووەك سەرێ لێیان

بکۆڵینـەوە، بەوشەی ڕەسەنی کوردی دەردەچن •

کوردەکان لەهەرناوچەیەکی کەوەدەستخۆیان ختووەولێی

دانیشتون ، نیۆەکانیان نەگۆڕیوەونەیان ویستوە نیـۆ ی

کوردیان لێ بنێن • پاشان لەسەر زۆرجێیان لە تازەربایجانی

باکوری ، نیۆی(٨) تورکی داندراون • هەروەها نیۆی کورد ی

لەســەرناوچەکانی لێوار ی باشوروباکوری دەریای خەزەر و

نێوەڕاستی ئێران ، دانەندراون . بەڵام لە هێندێـــك جێ نێوەکانیان ، وەڕاوێژی کرمانجی دەچن . لەناوچەکانی تری ئێران ، نێوەکانی مادی وئاریایی وەرگەڕاونەتەوە - سەر کوردی .

لاموایە : هەربەوچەشنەی کە نێوی فرانك لە وڵاتـــی فەرانسەی ، وردە وردە جێ نشینی وشەی گۆڵ gaul بووە وشەی کـــورد بەش کەمکەمە وشەی مـــاد ی قوت داوەو لە پاڵ خۆی داجێی کردووەتەوە و بووەتەجێ نشینی ئەو. (دو وتارەکانم کەلەگۆڤاری گەلاوێژی ژمارە۲و۳ی ساڵی ۱۹٤۰ لە بەغدا دەرچونە هەرلەسەرئەومەبەستەی دەڕۆن وبە جوانی بەرچاودەخەن کە چلۆن وشەی کوردە وشەی مادی لە خۆی دا جێ کردووەتەوە.) دوای نەمانی نێوەکانی مادی و پەرە - سەندنی نێوەکانی کوردی ، بەڕونی نازانین کەنگێ نیـــوی کرمانـــج وەدی هاتووە .

بەشێك لەوکوردانەی کە گەڕۆك نـــەبون وژیانی بە دابی خێڵاتی وڕەوەندی ولەژێر ڕەشماڵ وچیغ وچادردا بونیان ، وەلا ناوە ، خۆیان نێونا وە کـــرمانـــج . کەماڵ بادیلی لە - کتێبی خۆی دا بە نێوی : " کورتچەگرامێری Kemal Badilli*

Kurtçe grameri, p.6 n.2

دەنوسێ : زازاکان بە خۆیان دەڵێن کەرد Kerd وبـــە

کرمانجان دەڵێن کەرداسی Kerdâsi دەکرێ بڵێین کە پاشبەندی âsi سەرچاوەکەی âsâ بوبێ • بێتو ئەوەشمان بەدل بێ وپەسندی کەین ، دەکرێ بڵێین کەرداسی رێ وشوێن و دابێکی کوردەواری دەحاشێنێ و وێدە چێ بڵێین ئەو وشەماکی کوردی هەیە • ئێستێ لەناوچەکانی سۆران وموکری دا بە دێهاتیێکان دەڵێنە کرمانج بەڵام لەنێوعەشیرەتەکان وشارێکان دا بە رەعیەت serf دەڵێن کرمانج • خەڵکی سولەیمانی وکەرکوك ، ئەونێوەیان لە بیر چووەتەوە ، کە چی شك لەوەی دا نییە کە ئەوانی گوران نین ونیشتەجێی شارەکانن ، هەرکرمانج بون وکرمانجن (فیرێدریك ریچ بە رەعیەتی دەڵێ : کرمانج)• هەرئەوانەی کە نێوی کرمانجیان لە بیر چووتەوە ، بە دێهاتیەکانی خۆیان دەڵێن مسکێن کە دەکرێ بڵێین بەوکەسانە دەکوترێ کەلە دێیان دا نیشتەجێن (ئەوقسەدروست نییە ، جوت بەندەشمان هەیەکەمسکێنی پێناڵێن • وەرگێڕ•) کوردەکانی ناوچەی زابی گەورە بە تایبەت ، بە خۆیان دەڵێن : کرمانج و بە زمانەکەیان دەڵێن : کرمانجی •

ئەحمەدی خانی وێژەوان ودانەری بلیمەت وگەورەی چیرۆکی پرلەشانوی قارەمانەتی مەموزین (١٦٩٣ زاینی) کەئەو کتێبەی بە شێوەی کرمانجی باکوری هۆنیوەتەوە ، دووشەی

کـــورد و کـرمانـج ی بە جوانی تێک چڕژاندووە و - تێکەڵی یەکی کردون . بۆ وێنـە بڕواننە شوێنەواری بەرز ولێهاتوی خواری :

داخەلق نەبێژەتن کوئەکرادە

بێ ماریفەتن ، بی ئەصڵ وبنیاد(۹) .

بفکر ژعەرەب هەتاوە گـورجان ،

کرمانجیە بویە شبە بورجـا ن(۱۰)

کوردەکان نێوی کرمانجیان لەسەرانسەری کورد ستان دا بڵاو کردووەتەوە وپێدا ویستێکی کۆمەڵایەتی وزمان ناسی بووەتە هۆی ئەوبڵاو بونەوەیە . چونکوشێوەی کرمانجی لەگشت شێوەکانی دی بەربڵاوترولەبارتربووە . ئەو شێوە بەربەرینـە ، بۆخۆی بەدوبەشی گرینگ دا بەش دەکـــرێ :

۱- کرمانجی باکوری (بایەزیدی، حەکاری ،بۆتانی،عاشتی ...)

۲- کرمانجی باشوری(سۆرانی ،موکری ،سولەیمانی ،سنەیی ...)

۳- کرماشانی ( کەلهوری ، لەکی، پشتکوهی)

لەدوا یین حاستی باکوری زێباری ورمێ ڕا بگرە تا نێزیک - ترین جێ بۆلای زابی گـەورە ، لەوێشەوە بیگرە تاکودەگاتـە زارکـی زابی چکۆلە ، ئەوە دەبێتە سنوری نێوان کرمانجی باکوری وکرمانجی باشوری . بەو چەشنەی ، بەربڵا وی وجێی هەرکام لەودو شێوانە ڕادەگەیێندرێ . من دەمێک لەمەوبەر

لەوتارێك داكەلەگۆڤاری گەلاوێژ(ژمارە٤ ئاوریل ١٩٤٠ ، بەغدا ) بەزمانی کوردی بلاوم کردووەتەوە ، بەوردی لە سەر چۆنیەتی دابەش بوون وجیاوازی شێوەکانی زمانی کوردی رۆیشتوم ولێیان دواوم ٠

وادیارە زۆربەرزاو مەسەرهتی لاوەکی ٠ با لەسەرڕا بگەرێینەوە سەر مەبەستەکەی خۆمان : دوکتورمەکەنزی دەنوسێ : " کۆن ـ ترین بەڵگە کەلەسەر کوردان دوا ون ، کتێبەکانی ئەو نووسەرانەن ، پۆلیبیوس لیڤی Polybims Livy وستـرابۆ Strabo و بەتایبەت سیرتی Cyrtii ئەودومێژونوسانەی کەلەسەرەوە باسمان کردن ، رادەگەیێنن کە کوردان لە قوشەنی مادوئاسیای نێوەراست لە پۆلی شۆرشگێرانی قوچەقانی[11] بەدەست دا ، خەباتیان کردووە ٠ لەحالێك داسترابۆ Strabo ئاشکراتررا دەگەیێنێ کە کوردەکان نەتەوەیەکی رانەهاتو و نەعاملاو بون کە لە کێوەکانی مەلبەندی ماد وئەرمەنستان وئێران دا ، رایان بواردووە ٠ بە پێی ئەوبەڵگە تاق ولۆقا ـ نەوە کە بە دەگمەن هەڵدەکەون ، مینۆرسکی بیروباوەری خۆی دادەرێژێ ودا دەمەزرێنێ ، کەبەڵێ : کوردەکان لە بەرەبابی مادەکانن ٠" من دەڵێم کەنەك هەرمینۆرسکی لەسەرئەوباوەرەیە بەڵکو زۆربەی زاناکانی دنیا لەسەر ئەو بیرو باوەرەن کە ، کوردەکان سەروەمادەکانن ٠ بۆ وێنە کتێبی کزێنۆفۆن بە ر

چا ودەخەین • ئەویش هەرئەوبیروبا وەڕەی دەردەخا •
یەکێکی دی لەوزا نا یا نەی کەدەڵێ ڕەچەڵەکی کورددەگەڕێتە-
وە سەرما دە، درێفەر G.R.Driver • کە کۆمەڵەنێویکی لـــە
نوسرا وەکا نی نوسەرەکۆنەکا نەوە وەدەرخستووە ولەسەرئـە و
با وەڕەیە کەئەونێوا نە، بونی کورد لەڕا بردو دا ڕا دەگەیەنێ•
وەکو: Cord- u یا ن Gord- i •••
درێڤەر بەوەشەوە ڕا نا وەستێ ودەڵێ : " کۆنترین شوێنە وا ر
وئا سەوا ری کوردەکا ن ، ئەوگلێنە وسوا ڵەتە سومێریا نـــە ن
کە لەژێرهەردداا بینرا ونەتەوە ودەگەڕێنەوەسەر سێ هــــەزا ر
سا ڵ بەرلەدا یك بونی عیسا - سڵاوی خودا ی لێ بێ - ولـە ســـەر
هێندێکیـا ن وشەی کا ر-دا Kar- da دەخوێنرێتەوە•"
یەکێك لەوگلێنا نە، سەردەمی پا شا یەتی شو- سین Shu-Sin
کەدەچێتەوە سەر ا ور Ur پێشا ن دەدا (١٩٧٨ پێش زا یینـــی)
و کا رداکا ی Kardaka لەسەردەخوێنرێتەوە •
(بڕوا ننە: ignate ، HAS ـ ٣٨)ئەوپیتە بزوێنا نەی کەلەو [١٢]
وشە کۆنا نەدا هەن، بۆمن زۆر جێی سەرنجن•من وا ی بۆدەچـــم
کەپیتە بزوێنەکا نی u,i لەپێ گە یشتن وگەشە کردنی aka
وە پێك ها توون •ئەگەر بەهەڵـە نە چوبم‌دەکرێ بڵێین : -
Gord-i,Kard- a کـە درێڤرنێوی بردون ، پێ گەیـــو و
گورا وەی ما کی کا رداکا ن Kardaka کە لەڕوی سوا ڵەتە-

کانی سومێری دا ، بینراونەتەوە و خوێنراونەتەوە ٠پلەی ئەو گوران وپێگەیشتنەوگەشەکردنە، بە جوانی لە نێوان ـ شێوەکانی کرمانجی دا بەرچاو دەکەون ٠ بنەڕەت و بناخەی جیاوازێکی کەلەنێوانیان دا دەبینرێ هچۆنیەتی پلەی ئەو گوران وپێگەیشتنەیە ٠

ئێستێ بۆئەوەی حەقم بۆلەدوبدەن ، وێنەیەکی دەخەمەبەر چاو٠ دیارە ئەووێنەیە مێوژێکەلەکەویژێك : بڕوانینەوشەی ڕەسەنی ، خان +ئەك ٠ بە شێوەی کرماشانی پێی دەڵێین : خان+ی ٠ بەشێوەی موکری و سولەیمانی پێیدەڵێین :خان+و ٠ بەشێوەی سنەیی پێی دەڵێین : خان+ئەگ ٠ دەبینین ئەووشەیە بەوچەشنەی ڕێگای گورانو گۆڕان وپەرەوازەبون و پێ گەیشتنی خۆی تێپەڕ کردووە : خانەك ← خان+ئەك ← خان+ئێك ← خان+ئەگ ← خان+و ← خان+ی ٠

گەلێك وێنەی دیکەش سەبارەت بەو مەبەستەی دەتوانین بەر چاو بخەین ٠ بەتایبەت لە وشەکانی کە بە کەشمی کارلێکراو (= اسم‌مفعول ) بەسەر زمانانەوەن ، وێنەیان زۆرە ٠ Aka ئەکە ، یەکێك لە پاشبەندە(١٣)ناسراوەکان وبەنێوبانگەکان ورەسەنەکانی کۆمەڵە زمانە سەروە هیندوئێرانین Indo-iranian ناوەرۆك ونێوئاخنی ڕوانگەی دوکتور مەکەنزی لەباتی ئەوەی زۆرتر مێژوویی بێ ، پتر زمانەوانیە ٠ کورت و کرمانجی بڵێین

مەکەنزی ددان بەسەر ئەوەی دا دێنێ کەناتوانێ بەڵگەی مێژ-
ویی بۆ سەلماندنی ڕۆانگەی خۆی بەرچاو بخا ، بەڵگەیەکی ئەو
تۆ کە ئێمە لەوی ڕلەبزانین کەنگێ ولەکوێوە زمانی کورد ی
لەسەر بنەڕەتی زمانی فارسی نێونجی ، دامەزراوە ویان لە
ژێر هێزی ویدا پێ گەیشتووە وڕاهاتووە ، مەکەنزی هەر بە
بەڵگەی زمانەوانی پشت ئەستورە و هەر بەویش دەخورێ •

جا ، لەبەر ئەوەیە دڵمان لەبیرو باوەڕەکەی ئاوێ نا-
خواتەوەو وە بەردڵمان ناکەوێ و بە کەیفێمان نییە •

ئەگەرچی لەمەڕ زمانی مادەکانەوە شتێکی زۆرمان بەدەستە-
وە نییە ، بەڵام ماکەکەی لە ئەوێستائی دا بەرچاودەکەوێ •
جا ، بەدڵنیاییەوە دەڵێین : زمانی مادی بناخەوهەوێنی
گشت ئەوزمانانەیە کە ئێمە ئەوڕۆ پێیان دەڵێین زمانە
ئێرانیێکانی سەروەپۆلی باکوری - باشوری •

لەلایەکی تریشەوە زمانناسەکان بە تێکڕایی لە سەر
ئەوەی سورن کە زمانی کوردی سەروەکۆمەڵەزمانەکانی
باکوری - باشورییە •زمانی ئاریایی کۆن وئەوێستایی
وکوردی کۆن ومادی ، ڕێیان بۆزمانی کوردی نوێ ، تەخت
وخۆش کردووە وپێشڕەووپێشەنگی وین •

دوکتورمەکەنزی کاتێك بەڵگەی بۆ ڕوانگەی خۆی
وەبەرچاو دەخا ، نایەوێ هەمو ڕێیان لە پیاوی ببڕێتەوە•

وبیروبا وەڕی خۆی بەسەرپیا وی دا بسەپێنێ و وا دەزا نێ کە شێوەکا نی کوردی وبەلوچی لەژێر هێزی زما نی فا رسی نێونجی دا ، بەرەوپێش دەڕۆن •دوکتورمەکەنزی کۆمەڵە شێوەکا نی فا رسی لەسەر بناخەی ڕوا نگەی تێ دێسکو Tedesco ڕیك دەخا وتێك دەخا تەوە وبەوچەشنەی چوا رچێوێك وگەڵاڵەیەکی لەو شێوا نە سا زدەکا وبۆهەریەکێك لەوشێوا نە جێیەك دیا ری وتەرخا ن دەکا وئەوجا ردەڵێ : " ئیما نیش لە ڕوی ئەوگەڵا لەوئەو چوا رچێوە یە وە بۆما ن دەردەکەوێ کە دەبێ زما نی کوردی لەزما نی ما دەکا ن جیا وا زی هەبێ و وەدەربخرێ • بۆ وێنەوشەی پا تەختی ما دەکا ن ۋبەرچا و دەخەین کەلەفا رسی کۆنەدا پێی‌دەکوترێ ، هەگمەتا نە یا ن هەنگمەتا نە• دەبینین وشەی گمەتا (١٤) کەلەودوو وشا نە دا دەبینرێ ، لەزما نی کوردی دا نییە وکەوا بو زما نی کوردی بەشی بەسەرزما نی ما دێوە نییە"•

من بیروبا وەڕی مەکەنزی ئا وا بەرپەرچ دەدەمەوە ولە وڵامدا دەڵێم: ئێمە لە شێوەی کرما نجی با کوری چا وگ (= مَصدَر)ێکما ن هەیەکەلە کەشمی تێپەڕ(= متعدّی ) دا دە کوترێ : هەنگا وتن ولەکەشمی تێ نەپەڕ(= لازم)دا دەکوترێ : هەنگوتن ولە شێوەی کرما نجی با شوری دا هەربەودوا نەدەڵێن : ئەنگا وتن و ئەنگوتن •

لام‌وایە دوکتورمەکەنزی کەشمی کرما نجی باکورێکەی لە قاموسی (١٥) زمانی کوردی بە فەرانسەکەی ژابای دا دیبێ٠ لەوێدا ژابا وای زانیوە هنگڤتن لە کەڤتن ڕا دێ ، کەچی ئەولێکدانەوەیەوبۆچونە دروست نییە و ژابا بەهەڵە چووە ٠ ئەنگاوتن واتە : لێدان ، لە شتێك دان ، لەنیشانەدان ٠ ئەوڕۆ ئەو وشە لە شێوەی سۆرانی دا ئاواڵ واتە ـ (= مترادف ) یەکێ هەیە بە نێوی : پێکان ٠ بێتو ئەو وشە لێکدراوەی ، لێك هەڵوەشێنین دە بێتە : پە+یەك+دان واتە : پێکەوە درون ، وێکەوتن ٠ ئوگوتن (هەنگوتن) واتە هەڵ هەنگوتن = هەڵەنگوتن واتە خلیسکان ، بەهەڵە چون ٠کەلەماکەکەدا دەگەڕێتەوە سەر: هەنگمەت٠

ئەووشە نەلەزمانی فارسی دا هەیە ونەلە شێوەی هەورامی دا ٠ بەڵام ئەنگاوتن لە زمانی پارتی داهەیە٠ ئەنگەودەن واتە تەواوکردن ، لەکاربونەوە٠ دووشەی تری کوردیش هەن کە ئەوانیش نیێزیکن لەهەنگمە، یەکیان ئاکام ، واتە: لەدوایی دا ، بەرهەمی مەبەستێك ٠ ئەوی دی ئەنجامە یە واتە: لاولاوەی دەرکەی ٠ هەردوکیان پێوەندیان هەیە لەگەڵ کۆمەڵە شێوەکانی باکوری ـ باشوری ٠

«بەشی لەسەر وشە ڕۆیشتن»

١) وشەی ئەسڵ م بەرامبەر بە The origin پێ باش نییە. چونکو لەزمانی کوردی دا ئەسڵ پتر بەکەشمی : ئاوەڵ نێو (= صِفَت) بەکاردەهێندرێ بەمانای : نەجیبە ڕەسەن و چاك کەپێچەوانەکەیشی دەبێتە : نانەجیب ، ناڕەسەن ، خراپ و نائەسڵ و بەدەڵ . وەك : لەگەڵ ئەسڵان (=کەسانی ئەسڵ) ، هەمو فەسڵان . لەگەڵ نائەسڵان ، هیچ فەسڵان .

« قسەی پێشینیان »

بێتوئەسپێ چەندئەسڵ بێ سواری چالاکی نەبێ

قابیلە ، دەرچێ لەمەیدانی جیدال وجێگەڕەوت .

« دیوانی دلدار ، ل ١٩ .

هەربۆیەش من بنەوبنەچەکەم هەڵبژاردووە .

٢) مینۆرسکی : مینۆرسکی ئێرانناس وکوردناسی Minorsky بەناوبانگی ڕوسی ، پێنجومی فێڤریەی ساڵی ١٨٧٧ زاینی لە ئاوایی ـ کرچووا ـ کە لە لێواری چۆمی ڤۆڵگایە هەڵکەوتبو (ئێستێ ئاوی ئەوچۆمەبەسەری کشاوە .) لە دایك بووە . دوای تەواو کردنی خوێندنی سەرەتایی وناوەندی لە شاری مەسکەو ، هەرلەو شارەش دا لە نێوان ساڵەکانی (١٨٩٦ تا ١٩٠٠) خەریکی خوێندن وفێربونی زانستی ماف (علم حقوق) ، (دوکتورجەمال نەبەزیش ـ علم‌حقوق ـ ی ئاوا وەرگێڕاوەتەوە سەرزمانی کوردی . کوردناسی ، چاپخانەی

کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٦٢)بووە ودوای شارەزا بوون وسەرکەوتن لەوپلەیەدا، بۆ خوێندن وفێربونی زمانەکانی سەروە ڕۆژهەڵات، چووەتە ڕێکخراوی لازاڕۆف وسێ ساڵ بەورەیەکی بەهێز وبە باوەڕێکی پتەو وبە هەولێکی بێ وێنە، بێ وچان وپشودان خەریکی ڕاهێنان وپێگەیاندنی خۆی بووە وپاشان بە چاکی ڕاهاتووە و پێگەیشتووە. لە ساڵی ١٩٠٣ زاینی ڕابۆ، وەدەستخستنی کاری دەوڵەتی، بووەتە یەکێك لەئەندامەکانی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری دەرەوەی ڕوسیەی تزاری. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٤ هەتا ١٩٠٨ بۆ هەڵسوڕاندنی ئەرکی خۆی، هاتووەتە ئێران ولەتەوریزبووەتە یاریدەدەری باڵوێزی ڕوسیەی تزاری. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٨تا ١٩١١ بۆبەڕێوەبردنی کاروبار، چووەتە پێتێرزبورگ وتورکستان. لەمەڕتورکستان شارەزایەکی ئەوتۆی وەدەستخستووە ودەستکەوتێکی زانستی وەهای کۆکردووەتەوە وپاشەکەوت کردووە کەتاکوئەوڕۆکەس لەو لایەنەیەوە – لەوی دەوڵەمەندتروگردەوەکۆتر وپسپۆرترنەبووە ونییە. (گۆڤاری یغما، سال نوزدهم، شمارەدوم، ماه اردیبهشت سال ١٣٤٥، دکترمنوچهرا میری)لە ساڵی ١٩١١بە نێوی باڵوێزی ڕوسان، ماوەیەکی لە سابلاخ(= مهاباد)وبوکان ماوەتەوە و نیشتە جێ بووە.

-Les Kurdes .Basile Nikitine, Paris, 1956.

imprimerie Nationale.P .97.

مینۆرسکی هەرلەوسەردەمەی دا بیروهۆشی خۆی بۆتێ ڕوا نیـــن لەهەموشتێکی کەسەرۆەکوردا ن بووە، وەکا رخستووە :

لەزما ن و وێژە، لە چۆنیەتی ژیا ن ،لەهەل ومەرجـــی ئا بوری ، لەبیروبا وەڕی ئا یینی ، لەبا رودۆخی کۆمەڵایەتی ، لە داب ورێ وشوێنی نا وخۆیی وهەڵکەوتی مێژویی ئەونەتەوە ـ یەی بەوردی کۆڵیوەتەوەوبە بنج و بنا وا نی بنەچەکەورەچە ـ ڵەکی کوردا ن دا ،ها تووەتە خوا رێ . لەئا کا مدا ، لێک دا نەوە ـ یەکی زا نستی ئەوتۆی وەدەست کەوتووە کە بووەتە بنەتۆوێکی زا نستی بۆ داچا ندن ە لەدوا ییش دا دا ی چا ندووەو بەدەغـــڵ ودا نێکی زۆروبا شە دا کەوتووەوخۆی وخەڵکی لەبەروبوحەسا ند ـ ووەتەوە. زۆرجا رلەخۆی پرسیوە :

چلۆن دەبێ ئەوهەموتەڵای دەستەوشا ن وگەوا هێرا تەوێژەیــە ومێژوییە لەلای ئەونەتەوە بەڕوا ڵەت دوا کەوتووە، هەڵکەوێ؟ خەنی لە خۆم کەبەسەرئەوخەزێنەی دا کەوتوم .

پا شا ن بووەتە با ڵوێزی ڕوسا ن لە ئەستەنبوڵ ، لە نێوا ن سا ڵەکا نی ١٩١٦تا ١٩١٨ دیسا ن بووەتەوە بە با ڵوێزی ڕوســـا ن لەئێرا ن ولە تا را ن نیشتە جێ بووە.بەڵام بە پێی دەرەتا ن و دەرفەتسەری لە مەڵبەندی کوردستا ن هەردا وەولێکۆڵینەوەکەی

بەردەوام بووە .

کاتێك تزار لەگل کەوتووە و ڕوسیەی تزاری لەگرێژەنەچووە و وڵاتی ڕوسیە ئیدی بە شێوەی بۆڵشویکی بەڕێوە چـــووە، مینۆرسکی کاروباری پێشوی خۆی وەلا ناوەو چووەتەفەڕانسە .لەساڵی ١٩٢٣ زاینی ڕا ، بووەتە مامۆستای زمانی فارســی وتورکی لە " فیرگەی نەتەوەیی زمانە زیندوەکانی سەروە ـ ڕۆژهەڵات

École Nationale des langues

orientales vivantes."

(وتاری خودا لێ خۆش بو- مجتبیٰ مینوی - لەپرسەی مینۆرسکی دا : گۆڤاری - سخن - ژمارە ٣ ، چینی شازدەهوم، خاکەلێوەی ساڵی ١٣٤٥، ل ٣٢٠) هەرلەودەمی ڕا بووەتە هاواڵ وهاودەنگی - علاّمە محمّد قزوینی - فرە زانای بەناوبانگ(١٢٥٤- ١٣٢٨) ولەئەزمون وپلەی زانستی یە کتریان کەلّك وەرگرتووەوکاتێك لەوڵام دانەوە ولێك دانەوەی مەبەستێکی گرینگ داڕتێ ماو ن ودا مانەوە یان شتێکیان لە دەستی عاسیە بووە، لە فریای - یەکتری هاتون وجێی هاوروبانگی یەکتری بون . (هەربەڵگەی سەرو- دبیرسیاقی وخانلری ل ٣٢٢).

لەوماوەیەدا ، لە جێژنی هەزارساڵ تێوەرسورانەوەی - فردوسی - دا بەشداربووە. پاشان لە ساڵی ١٩٣٠دا وڵاتـــــی فەڕانسەی بە جێ هێشتووە وچووەتە لەندەن ولەساڵی ١٩٣٢ ڕا

بووەتە ماموٚستای زمان وویٚژە ومیٚژوی ئیٚران لە " فیٚرگەی زمانەکانی سەروە رۆژهەلات London school of oriental studies."

دوای چەند سالیٚك وازی لە کاروباری دەولەتی هیٚنا وەوتا دوا پلەی ژیانی هەرلەشاری کمبریج Cambridge بەنوسینی کتیٚب ونامیلکە ولیٚکوٚلینەوە وپیٚ دا چونەوە وشی کردنەوە و ولام دانەوە ، رایبوا ردووە. بەتایبەت رۆژنەبووە- بەلانی کەمەوە- دیٚریٚك لەمەرئیٚران وکوردان ، نەنوسیٚ یان نە- خویٚنیٚتەوە. چونکو پربەدل ئیٚرانی خوٚش ویستووە وهوٚی ئە و خوٚش ویستنەی ئاوا بوٚ- محمّدعلی جمال زادە - دەنوسیٚ :

" من زوٚرنان ونمەکی ئیٚرانیانم کردووە وئیٚران بەنیشتمانی دیکەی خوٚم دەزانم". ( گوٚڤاری : دانشکدهٔ ادبیّات تهران ، ژمارە یەك ، سالی دووەم، رەزبەری سالی ١٣٣٣).

لە سالی ١٣٣٤، لە کوٚنگرێی ابوعلی سینا ، دابەشدار بووە وکەمیٚك لەسەر ئایینی ئەهلی حەقق رۆیوە. سالی ١٩٥٤ بوٚ بەشداربون لە کوٚنگرێی نیٚونەتەوەکانی رۆژهەلاتناسان ، بوٚ دوایین جارهاتووەتە ئیٚران وچەند وتاریٚکی لە زانکوٚی تاران بە دیاری ، پیٚشکەشی گویٚدیٚرە تامەزروٚکان کردووە .

مینوٚرسکی نیشتمانی خوٚی - روسییە- ئیٚجگار خوٚش ویستووە ودلیبوٚئەوێ هەر کورکاندویەتی! کاتیٚك بەلەش و روالەت

لەوڵاتە خۆشەویستەکەی دور بووە، گیانی هەرلە ڕوسیەی لە هات و چو دا بووە وپەرۆشی ئەوەی بووە کە نەکا ڕێی لە و ڵاتەکەی نەکەوێتەوەولە کۆڕپەی دڵی خۆی - ڕوسیە- دیدار ئاخربێ ولەهەندەران گۆڕغەریب بێ و ئاواتی دیتنەوەی وڵا- تەکەی ببا تە بن گڵی! خودا و ڕاستان لە لایەن کاربەدەستا- نی ڕوسیە، بۆ بە شداری لە کۆنگرێ ی نێونەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان لەمەسکەوێ ، لێیدەگێڕنەوە. بزانین بوخچەی دڵی خۆی چلۆن بۆ سپهبدا مان اللّه جها نبانی دەکاتەوە :

" ... کاتێک لەلایەن کاربەدەستانی کۆزانی (فرهنگستان علوم)ڕوسیە، لێیان گیڕا موەبەدا و ودڵ خۆم ساز کرد وهەر شایم لەدڵی دا دەگەڕا . بەخۆم دە کوت: ئەوا پێش ئەوەی گڵ لەبانی چاوم کەن وبەنامرادی سەربنێمەوە،ئاواتەکەم وەدی هات و ڕوسیە گیانی دەبینمەوە، ئەوجاردەربەستی شتی دی نیم وپەکم بە هیچ شتی دی ناکەوێ .

بەڵێ ، کاتێک لە پاش چل وچوارساڵی ئازگارهەڵوەدایی چومەوە ڕوسیە وچاوم بە دیتنی هاو وڵاتێکانم ڕون بووە و - دیسانیش بەزمانی زگماکی- ڕوسی - قسەم لەگەڵ کردن ،پێیان خەنی بومەوە! دەمکوت: ئۆخەی! جا ئەوجاربا بمرم !

کاکە جیهانبانی : کاتێک خەڵکی ڕوسیەی منیان چاوپێکەوتەوە لێم وەکۆبون وهوروژمیان کردمێ ولەباوەشیان گرتم و وەک -

گۆشتی قوربانی هەرکەســە بۆلای خۆی دەکێشام !

کاتێک بە نێوی راپسپاردە بۆ بەرێوە بردنی ئەرکــــی ـ زانستی چومەوە لێنینگراد، مەسکەو، بادکوبە، ئێرەوان و تفلیس ، هەرخەڵك بو خۆی تێ هەڵدەقوتاندم. داخوازی ئەوەی بون بزانن ئەوها و ولاتیــە هەڵوەدایە، پەریوە وهەڵدێردراوە و دورکرا ولەوولاتی خۆی ولەهەندەران چلۆن رایدەبوێرێ ؟ ! چ ئاسەوارێــکی وەدەر ختووە؟ بەرهەمی ژیانی چ بووە؟

جێی منیان لە قاتی ٢٤ میوانخانوێك لەمەسکەوێ تەرـ خان کردبو، ئەوەندە حەشیمەت بۆ دیتنی من رێچکەیان بەـ ستبو وبۆلام دەهاتن کە حەجمان وئۆقرەیان لە هەڵسورێنەرەـ کان وکارکەرەکانی میوانخانووەکە هەڵگرتبــو. چم دی وچــم چاو پێ کــەوت؟ لەگێڕانــەوە نایــە ! "

(گۆڤاری ، یغما ، ژمارە ٢١٥ساڵی نوزدەهوم، چینی سێ .)

مینۆرسکی ،لەئاخروئۆخری ژیانی داسۆمایی چاوی لەســـــەر نوسین وخوێندنەوەو راهێنان و پێ گەیاندنی خوێندکارەکانی خۆی دانا وئاوا بۆ ـ محمد علی جمال زادەـ دەنوسێ : " ... لە پاش سلاو، ماوەیەکە ئەوەندە چا ووچرم بەسەر لاپەرە نوـ سراوەکانی خوێندکارانی ئێرانیم ـ بونمرە دانان ـ داگرتووە، کە بە باشی نابینــم! "

چەندمانگ لە پێش مردنی ،بەو چەشنەی وەرەزی وپەرۆشی خۆی

بە دوکتور خانلری ڕاگەیاندووە : " ... پارچە هەڵبەستە دڵڕفێن وبزوێنی هەڵۆی تۆم ، خوێندووەتەوە ، کاتێک خەم دام دەگرێ وکوڵی گریانم هەڵدەستێ ، خەم ڕەوێنم پارچە هەڵۆکەی تۆ و چەند شتی دیکەیە. بەڕاستی پێیان دەبژوێنمەوەو سۆکنایی دڵم پێی دێن ."

ژنەکەی ەیای تاتیانا ئەلێکسیونا مینۆرسکایا ، باری هەمو لەنگ و لۆرێکی زانستی و ژیانی بۆ ڕاستکردووەتەوە.
لە لێکدانەوەو هەڵاویژی وشی کردنەوە ولەسەر ڕۆیشتنی هەرمەبەستێک بەفریای مێردەکەی هاتووە. دەست نوسی هەموشوێنەوارەکانی مێردەکەی خوێندووەتەوە وپێیان داچووەتەوە وبیروباوەڕی خۆی سەبارەت بە نوسراوەکان ، بۆمینۆرسکی دەربڕیوە ، پەڵەی بۆلادا وەو هەڵەی بۆ ڕاستکردووەتەوە، لە نوسراوەکانی دا کاکڵی بۆ دەستنیشان کردووە و تێکوڵی پێ ڕاگەیاندووە . مینۆرسکی ش بە چاکەی وی زانیوە ولەزۆرجێ سپاسی لێ کردووە.

چەند زمانێکی کە زانیونی بریتین لە: ڕوسی - فەڕانسە، ئینگلیسی ، ئیتالیایی ، ئاڵمانی ، لاتینی ، یۆنانی ، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئەرمەنی ، گورجی و کوردی .
گۆڤاری لێکۆڵینەوەکانی سەروە رۆژهەڵات بە بۆنەی پێ لە ٧٥ ساڵ نانی مینۆرسکی ، ژمارەیەکی خۆی بۆ بیرەوەری لە

مینۆرسکی ترخان کردووە. هەروەها گنجینۀ تحقیقات ایرانی ، شمارە ٥٧ ، انتشارات دانشگاە تهران لە سالی ١٣٤١ دا بە دەر خستنی کتێبێك ، سپاسی کردووە لەمینۆرسکی ونرخێکی زۆری داناوە بۆبیری ورد ودەسەلاتی زۆر و هەلکەوتویی بەرچاوی وی ، لەنوسین ولێکۆلینەوەوپشکنینەوەی هەردوك ئەوبەلگەناوبراوانە داچەند پسپۆرە چازانەهۆزان وپیتۆلی نێونەتەوەییٔ مەبەستیان نوسیوە وبەدیاری پێشکەشیان کردووە بە مینۆرسکی.

مینۆرسکی پاش کردنی دەست و بردێکی زانستی زۆر وحەول ودەولێکی بێ وچان بوناسین و ناساندن ونوسینی پترلە ٢٠٧ شوینەواری گرینگ وباوەرپێ کراوە روزی ٢٥ مارسی ١٩٦٦، کاتێك کە ٨٩ سال ومانگێك وپێنج رۆژ لەتەمەنی رابردووە، گیانی دەرچووە. لەوئاسەوارانەی خوارێی خۆی دا لەسەرکوردوزمانی کوردی رۆیوە :

١- سازمان اداری حکومت صفوی یا شرحی برتذکرة الملوك ،ترجمهٔ مسعود رجب نیا ، کتابفروشی زوار ، لەو کتێبەداهۆزەکانی کوردان بەرچاودەخا (لاپەری ٢١٠)ورا دەگەیەنێ کە هۆزەکانی کوردانشان بە شانی شۆرشگێرانی هێزی سەفەوی لەگەل دوژمن شەریان کردووە. هەروەها چەند وشەیەکی وەك :قۆرچی یەساول ،جبەخانە،قوشون(= قۆشەن)ی بەر اوەرد کردوون وما-

کەکەیانی دیوەتەوە • بەتایبەت زۆرشتی نادیاری ورە -
قمان لە بەیتی دمدمدا بۆ دیاری و هاسان و ڕون کردووە -
تەوە •

٢) دەقی وتاری مینۆرسکی لە کۆنگرێی <u>ابوعلی سیـــــتا</u>
(گۆڤاری : دانشکدهٔ ادبیـّات تهران ، شماره١ سال دوّم
مهرماه ١٣٣٣) لەو وتارەدا نەختێك لە سەرئایینی ئەهلی
حەقق ڕۆیشـــتووە •

٣- Mongol place- names in Mukri Kurdistan.1957.
نێوە مەغولێکانی کە لە مەلبەندی کوردستانی موکری لـــە
سەر چەند جێ دا ندراون وەکو : یەرغو(= محاکمه- بازرسی و
تحقیق• جلد سوم، تاریخ ادبیّات دکترذبیح للّه صفا ، صفحهٔ
٣١٠)، سلدوز، ئێل تەیمورە سو وخبولاغ(= ساوجبلاغ،مها باد)
...

٤- وتارێك لەمەڕ بنج وبناوانی گوران (= هەورا مـــانی )
وویژەی گورانی(= هەورامی) London, school of oriental studies, 1943.
گۆڤاری فێرگەی زمانەکانی سەروەڕۆژهەلات • ناجی عە ببـاس
ئەو نامیلکەیەی لە ئینگلیسیـەوە کردووەتە عەرەبی •

٥- نوسینـی چەند وتاری باوەڕ پێ کراو لـــە :
Encyclopedie de l'islam. قاموسی ئیسلامی بـــە
زمانی فەڕانسە • وەکو: وشەی کورد Kurde مسووخبولاغ -

(= ساوجبلاغ، مها باد) Saoudjboulag وبوكان

• Boukan

٦- كتێبێك لەمەڕ ئاييني عەلي يەڵلاهی ، بەزمانی روسی . Mate ri aux pour l'é tude de la secte des gens de la ve rite ou Aliilahi.Moscou,1911.en russe.

٧- وتارێك لەمەڕ ئەهلی حەق Notes sur la secte des Ahl- e - Hqq.Paris,1921,in R.M.M.

٨- نوسینی ژیان نامە وچۆنیەتی هەڵبەستەکانی شاعیرە بەناوبانگەکانی چەرخی نوزدەهومی کوردەواری (نالی ، کوردی، سالم، حاجی قادری کۆیی ،...) لە Encyclopédie d'islam. بە زمانی فەڕانسە .

٩- کتێبێك بە نێوی : کوردان.لەبەرەبابی مادانن،وەرگێرا و لە ئینگلیسیەوە بۆسەرزمانی عەرەبی ،(کەمال مەزهەر، کۆڕی زانیاری کورد، ب١، ١٩٧٣ ل ٥٦٠ .)

١٠- ژابا، لە نێوان سالی ١٨٤٨تا ١٨٦٦ بالوێزی ڕوسییەی تزاری لەئەرزڕۆمی تورکییە بووە وبەناوچەکانی مێرگ وئالاـ گوێز وعیشق ئاواداگەڕاوە و وێرای ڕەعەمەل هێنانی ئەرکی بالوێزی بەیت وباووهەتەڵۆکە ومەتەڵۆکە... ودەست نوسی بە نرخی زۆری لە شوێنەوارەکانی شاعیرەکانی کوردەواری ، کۆ کردووەتەوە وشارەزای شێوەی کرمانجی ژورو بووە وچوار

کتێبی بە فەڕانسە وەدەر خستووە :

1.Recueil de notices et re cits Kourdes servant a la connaissence de la langue de la litte rature et des tribus Kourdistan,re unis et traduits en francais,St pe tersb ourg.1868(in:8xiii pt 133p).

2. Dictionnaire Kurdo- francais. St.pe tersbourg, academie des sciences.1879,4 XVIII 463.

3.Un grand dictionnaire france- russo- Kurde.

4. Un Livre de Conversation , franco- Kurde.

بەڵام بەرهەمی زانستی ژابا، هەر ئەو کتێبانەی سەرەوە نەبووە بەڵکو کەرەستەی زانستی زۆری دیشی کۆکردووەتەوەکە پاشان بەجورێکی نهێنی لەگۆری دانەماون و ون بون . مینۆرسکی وەك چاوئێشەدا روەسۆراغیان کەوتووەوشوێنی هەڵگرتوون ورای ئەسپاردووەتە خاووخێزان ومیراتگرانی ژابای کە هەمو جێیەکی سەنگ و سوژن بدەن.پاش ماوەیەك بە یارمەتی نەوەکانی ژابای ئەوبەرهەمە مێژویی و وێژەیانەی وەدی هێناوەتە-وەومینۆرسکی پاش دیتنەوەیان ، ئەوخەزێنەی پێشکەشی بەرێوەبەرایەتی زانستی روسییەی کردووە .

ئێستی لە شاری لێنینگرا دکۆگەبەڵگە(= ئارشیو)یەك هەیە بە نێوی: " ئارشیوڤاادبیاتیت کوردان" کەلە کەمێکیان

بەدەر نەبێ ، هەموی بەگردەوە کۆیی ژاباى وەدەست کەوتون وهەر ئەوانەن کە مینۆرسکی دیونیەوە .

١١- وتارێك لە ژێرنێوى " بنیچەورەچەلەکی کوردان" کەلە بیستومین کۆنگرێی رۆژهەلاتناسان ، لە سالى ١٩٣٨ زاینى دا ، لە بروکسێل لەلایەن مینۆرسکیەوە،کوتراوە .

٣) ئیدمونس C.J.Edmonds چەند سالێك لە بەغدا خەریکی لێکۆلینەوەی زمانی کوردی وشێوەکانی ئەوزمانە بووە وپاشان بووەتە ماموستاى زمانی کوردی لە لەندەن . ئەوەندەی من بزانم شوێنەوارەکانی ئەوانەن :

1.A Kurdish lampoonist Shaikh Risa Talabani,in j. of the Royal central Asian Society,Vol XXII January 1935.

لەوکتێبەی دا ئیدمونس را دەگەیەنێ کە هەوینی شوێنەوارەکانی وێژەی کوردان هەرشەروئەوین نین ، بەلکوفرا وێژیش جارجارنا وەرۆکی هەلبەستی شاعیرەکانە. بۆ وێنەباسێکیجوان وپاراولە شێخ رەزاى تالەبانی دەکاکەزۆرکەس وزۆرشتی وەبەر پللارى تەوس وتوانجو جنێوولاتاو وتانەوتەشەر داوە. دێرك کینان Derk kinnane لە کتێبی کورد و- کوردستان The Kurds and Kurdistan دالەومەبەستەی کەلك وەرگرتووە.(لەندەن، ١٩٥٤زاینی ،ل ٦).

Heronden
Hawkhurst, Kent
19/1/53

دوستی زانا و خوشەویستەکەم سید علاء الدین

نامەکەی شیرین و کتیبەکەی رەنگین «میژووی ئەدەبی کوردی» کە ناردبووتان گەیشت زور زور سپاستان ئەکەم و بە دڵ گرمیەوە پیروزبایی‌تان لی ئەکەم کە لە پاش ئەوەندە ساڵ رەنج و کوشش توانیتان ئەم کارە بسنە برهەم و کە بە لە ژیرچاپ چوون ی ئەم نوسراوە گرنگە اواتەخوازە دیرینەکەتان هاتە دی بە راستی ئەمە خزمەتیکی گەورەیە نەک تنیا بە کوردەواری بەلکو بو گشتی ی زانست گشتی و هەموومان کە پیوەندی‌مان هەیە بە ئەدەبیاتی روژهەلات منتداری ئەو ماموستای پایەبەرزە ئەبینین

ئیتر هەمیشە تکای تەندرستی و سەرکەوتنتان ئەکەم

دوستدارتان

ادموندس

" دەستنوسی ئیدموندس "

٢- نوسینی سەرەتایەك لەسەر كتێبی " ناسینی شێوەكانی زمانی كوردی " كەنوسەرەكەی مەكەنزییە ٠
٣- هەڵاویژی ونرخ دانانێك لەسەر كتێبی : " مێژوی ئەدەبی كوردی ٠علاء الدین سجادی ، چاپی دووەم١٩٧١ ، ل ٦ " ٠
وێنەی دەست نوسەكەی ئەوا بەرچاو دەخەین ٠
٤- فەرهەنگۆكێك بە دوزمانی كوردی ـ ئینگلیسی لەگەڵ ماموستا تەوفیق وەهبی بەگ، كە رێكخراوی ئاكسفورد بوی بڵاوكردونەتەوە ٠

**Wahby.Taufiq and Edmonds.c.j.A Kurdish-English dictionary,Oxford 1966.**

**5.Une Bibliographie du Kurde meridional,1920-1936(j.of R.C.A Asian soc,Vol.XXIV;july1937).**

ناسینی نیوی چەند كتێبێك كە بە شێوەی كرمانجی باشوری نوسراون وبڵاوكراونەتەوە٠

٤) كورد ناسی : وشەی كوردناسی یان ماموستا زەبیحی وماموستا جەمال نەبەز كوتەنی: كوردەوانی ،لە مێژە لەسەر زارانەوبەچاكی خوی ناساندووە٠ بەزمانی ئینگلیسی: كوردەـ لەجی، بەفەرانسە ، كوردولوژی وبەئالمانی كوردولوگی وبە روسی ،كوردەڤیدینی پێ دەڵێن٠
كوردناسی بریتیەلە كومەڵە زانستێك كە هەموشتێك ومەبە ـ

ـ ستێـك دەگرێتەوەكەلەمەڕ نەتەوەی كورد وزمانی كوردی دا بێ • وەك : شێوەكان وزاراوەكانی زمانی كوردی ، وێژەومێژـ وی كورد، بارودۆخی ئابوری ناوچەی كوردستان و•••

كوردناسی بەشێكـە لە رۆژهەڵات ناسی • بوئەوەی زۆرترسەرەوـ دەر لە كورد ناسی بكـەن ، بڕوانند ئەو سەر چاوانە:

١ـ بەركوتێكی خەرمانی كوردناسی لەئوروپا ، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد• بەغدا ،١٩٧٤ زاینی •

٢ـ زمانی یەكگرتوی كوردی ،دانەر: جەمال نەبەز، ١٩٧٦ زاینی ل ٩٧ •

٣ـ كتێبی: Les Kurdes نوسەر: بازیل نیكی تین، پاریس ، ١٩٥٦ زاینی ، لاپەڕەی ٢٩٣ •

لاموایە لە زمانی فارسی دا ، بۆجاری یەكەمین ، وشەی كوردـ ناسی لەلایەن ـ سیدمحمدعلی جمال زادە ـ سەبارەت بەوتارێك لەمەڕـ بازیل نیكیتین ـ بەكارهێندراوە• بڕوانند: " مجلهٔ یغما ، شمارە نهم، آذرماه١٣٣٥صفحه ٤٠٦" •

ولەزمانی ڕوسیدا بۆیەكەمجار Vil tchevsky ڤیلچەڤسكی لە ناميلكەيەكدا لەژێرنێوی" ماڕوكوردناسی":

Marr et la Kurdologie, 1936.

وشەی كورد ناسی ـ كوردۆلۆژی ـ بەكاربردووە.بۆوەدەست خستنی مەبەستـــی پتـــر ، بڕوانـــــە :

1. Les Kurdes, Basile Nikitine, Paris, 1956 P. 8

2. La première conferance de Kurdologie et le probléme de la langue littéraire Kurde. in: Le Lang age et la pencée 1936.

بەکوردی دەتوانین بلێین: بەدوای پەرەسەندنی وشەی ڕۆژهەلات ناسی ، ئەو وشەش بەکار هێندراوە .

٥) ناوەرۆکی وتاری مینۆرسکی لە بیسترمین کۆنگرێ ی ڕۆژهەلات ناسان لە برۆکسێل لە سالی ١٩٣٦ زاینی وێرای نێوبردنی هەمو سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی نێونەتەوەکان بۆسەلماندنی ئەوبیروباوەڕەی کە مادەکان باپیرەگەورەی کوردانن ، ئاوا دەلێ وڕادەگەیەنێ : کوردان بە خۆیان دەلێن : کورمانج ، ئەگەربە چاکی سەرنج بدەین ، دەبینین کەئەو وشەساکارنییەولێکدراوەولەپێک گەیشتنی دو وشەی کوردە مانج پێک هاتووەوپاشان ئەو وشانەلێک ولوس تر بون وسواون وبونەتە کورمانج یان کرمانج. واتە: کوردی سەر وەماد . بۆ پەرە پێ دانی زانست لەولایەنەوەبڕوانن : وتاری: کوردەکان Les Kurdes لە قاموسی :

L'encyclopedie de L'islam.

٦) دوکتورمەکەنزی D.N.Mackenzie مامۆستای زمانی کوردی یە لە " فێرگەی ڕاهێنەروفێرکەری زمانەکانی

سەروە ڕۆژهەلاتی وئا فریقا یی لەندەن ." بیروبا وەڕی وی سەبارەت بە زمانی کوردی لژی ڕوانگەی پە سند کراوی ئاسا- یی پسپۆرەکانی زمانەوانی ئەو ڕۆیە. مەکەنزی مەبەست وئامانجەکانی خۆی لەوسەرچاوانەی خوارەوە دا نوسیوە :

1.The origins of Kurdish. Transactions of the philological society 1961.Oxford,Black well. 1961.

واتە: بنچینەکانی زمانی کوردی . هەرمەبەستەکانی ئەو گۆڤارەی بون کەما مۆستای زانا ، - تەوفیق وەهبی بەگ نوسە- ری ئەونا میلکەیە- ودوکتورجەمال نەبەز- ماموستای ڕەگەز- ناسی گەلانی ئیران وداب وشوێنی کوردان لە زانکۆی ئازادی بێرلینی ئالمان - ی لە خۆی قەلس وتوڕە کردوون وەهەر کا میکیان بۆ بەر پەرچ دانەوەی بیروبا وەڕی مەکەنزی کارێکیان کردووە : ماموستا تەوفیق وەهبی ئەو وتارەی -کەوا بەدەستانەوەیە - پێکەوە ناوە وماموستا جەمال نەبەز- یش لە کتێبێکی خۆی دابە نێوی <u>کوردستان وشۆرشەکەی</u> - بەزمانی ئالمانی - هێرشێکی توندی بردووەتە سەرمەکەنزی (بڕواننە: کتێبی بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی ل ٤٢).

٢- کتێبی ، ناسینی شێوەکانی زمانی کوردی . مەکەنزی لەوکتێبەی دا ، لە ڕوانگەی تێدێ سکوی ئالمانی وەرا ، چاو

لە شێوەکانی کوردی دەکا وپێی وایە ‌زمانی کوردی بەشی بەسەر زمانی مادی وە نییە •

٣- وتارێکە کە مەکەنزی لە کتێبی : " یادنامە ایرانی مینۆرسکی ، ازانتشارات دانشگاه تهران ، سال ١٣٤٨ ، - گنجینە تحقیقات ایرانی ، شمارە ٥٧ بەاهتمام مجتبی‌مینوی وایرج افشار ، صفحە ١٢٥" لەژێرسەر دێری " مەلای‌جەزیری وفەقێ تەیران " نوسیویە• لەو وتارەی داچاخی لە دایک بون وکۆچی دوایی هەردوك شاعیرە ڕادەی شارەزاییان لە هۆندنەوەی هەڵبەست و گوڵبژێرێك لە هۆنراوەکانیان بەرچاو خراون • نوسەر شتێکی نوێ ی لەمەڕ ئەودو شاعیرەی وەدەر نەخستووە • تەنانەت ڕاوێژەکانیانیشی پێکەوە هەڵنەکێشاون وجێی وێك چونیان و وێك نەچونیانی بەر چاو نەخستون •ئەوا وێنەیەك لە دەست نوسی مەکەنزی دەست نیشان دەکەین •

٧) فارسی نیوونجی (= فارسی نێوەڕاست= پەهلەوی) زمانێکە نێوان فارسی کۆن و فارسی ئەوڕۆکە • کتێبەکانی سەروە ئاینی زەردەشتی وکارنامەی ئەرتەخشیری پاپەکان وچەند کتێبی تربەوزمانەی نوسراون • هەڵبەست و هۆنراوەکانی ئەوزمانە بە پێی برگە(بانگ= هجا = مقطع= پەنجە =سیلاب =بخش )هەڵبەستراون• ئەوکێشەگەلێك لەکێشی -عروضی - کۆن ترە • هەروەها گۆرانی ، بەیت ،لاوك وحەیر-

-ا نسی زمانی کوردیش بە کێشی بڕگە هەڵدەبەسترێـــن وزۆربەی ئەوانە ٧، ٨، ١٠ بڕگەن . کە وابو کێشێ - عروضی- کە شاعیرانی ئێمە بۆ هۆنینەوەی هەڵبەستەکانی خۆیـــان رەچاویان کردووە ، خۆمالی نین ولاوەکین . بڕوانـــە : ( تاریخ ادبیات دکتررضا زادە شفق ، ١٣٢٠ ص ٦). کێش وقا ـ فیە لە شیعری کوردی دا ، چاپخانەی الوفا ، بەغدا ، ١٩٦٢ ـ ل ٨ ) . واچاکە لەهەریەک لەو کێشانەی باسمان کردن ، ـ وێنەیەکی پێشکەش کەین :

حەوت بڕگە

سەرت هەڵێنە بابم لەبەندت حالی نابم

سە+ رت + هە+ لێ + نە+ با + بم.
لە + بەن + دت +حا +لی +نا + بم

---

هەشت بڕگە

ئەوشەونەبوە شەوێ دێنێ بەخەیال چومە مەدینێ
خزمەت پەریزادەی چینێ

ئەو+ شەو+ نە+ بو+ شەوێ + دی + نێ

بە+ خە+ یا ل+ چو+ مە+ مە+ دی + نێ

خز+ مەت + پە+ ری + زا + دەی + چی + نێ

---

دە بڕگە

قاقەزدەنوسم بەخوێنی دەستم دەیدەم بەشەمال لەبیبا بۆدۆستم

قا + قە ز+ دە+ نو+ سم+ بە+ خوێ + نی + دەس + تم

دەی + دەم+ بە+ شە+ ماڵ + بی + با + بۆ+ دۆس+ تم ٠
ڕەنگ بێ مەکـەنزی ، هەرلەبەر ئەوەی کە هەڵبەستەکا نـــی
ئەودو زما نا نە بە پێی با نگ، هەڵدەبەسترێن ، پێی وا بـێـی
زما نی فا رسی نێونجی زۆر کا ری کردووەتە سەرزما نی کوردی!
کەوا بێ زما نەکا نی سەروە بنەما ڵەی هیندوئورۆپا یی دەبـێـی
هەمویا ن ، کا ریا ن لەسەریەك کردبێ ، نەك هەر ئەو دو ـ
زما نە٠

٨) وەك : سووخبولاغ (= سا وجبلاغ = مها با د) ، بۆغدە ـ
کەندی ، یەرغو، سلدوز(= سندوس ) ، ئیل تەیمور، کا تیـێـك
مەغولەکا ن ئێرا نیا ن گرت ومەرا غەیا ن کردە پا تەخت ولەدەو ـ
را نیشتی ئا زەربا یجا ن بلاّ و بونەوە، زوربەیا ن هەر لەووڵاتەی
نیشتەجێ بون ونێوی مەغولییا ن لەسەر نیشتما نی نوێ خۆیا ن
دا نا ٠ پا شا نیش ئێلخا نێکا ن زۆرجا ربەربۆنەی چونەهەوا ری ، ـ
ها تونەتە دۆڵەکا نی گەرمی جەغەتووهێندێکیا ن لەومەلبەندەی
ما ونەتەوەو ئەوا نیش نێوی تورکیا ن لەسەر نیشتما نەکـــەی
نوێ ی خۆیا ن نا وە ٠ وەکو: سلدوز، ئیل تەیمور، ٠٠٠ پا ش
ئەوا نیش ، گەلێك لەوکەسا نەی کە سەروە تەیمورێ لـــەنگ
بون ، لەمەلبەندی جەغەتوداجێ گیربو ن ٠

پا ش کورەکا نێـکا ن ، سەفەویەکا ن ، ها تون وسەردا رغێلە ـ
کا نی برا دۆست وموکریا ن سەرکوت کردون ٠(بڕوا نئە : تا ریخ

عالم آرای عبّاسی ، اسکندربیگ ترکمان ، دبیر مخصوص شاه عبّاس اوّل صفوی ، چاپ دوّم ص ٧٩٦ به تصحیح وتنقیح ایرج افشار) وسولّتان میرموقەددەم نێوێکیان کردووەتە بەرێوەبەری مەراغە وئەویش دەست وپێوەندی خۆی بەدەور و بەری مەراغەی دا بڵاو کردووەتەوە وهێندێکیان هەرلە و مەڵبەندەی دا گیرساونەوە و وایان پێ خۆش بووە نێوی شوێنەکان بگۆڕن وبیان کەنە تورکی •

لەسەروبەندی پاشایەتی قاجاریشکا نیش داچەندما ڵێکی تورك بەنێوی قەرەپەپاق لە قەفقازەوە رایان کردووەتە ئێران ولەمەڵبەندی سندوس داجێ گیربون وئەوانیش بە نۆرەی خۆیان ، نێوی نیشتمانەنوێ یەکەیان گۆڕیوە•

(کورتە وەرگێراوەیەك بوٚلە کتێبی : Mongol place-names , in,Mukri Kurdistan,1957, London.

نێوە مەغولێکانێ کە لە مەلبەندی کوردستانی موکری لە سەر چەند جێ داندراون • ئەو کتێبە بە نێوی ـ جغرافیای تاریخی کردستان مکری ـ وەرگێردراوەتەوە سەرزمانی فارسی ) •

٩) ویژەر (ماموّستا وەهبی) ئەو هەڵبەستەی دەقاودەق لە مەموزین ، احمد خانی ـ خوّش کراو وشی کراوی م• ب •رودێنکو ١٩٦٢ لاپەرەی ٣٥،دێڕی ٢٤٠ ـ هەڵبژاردووە •

١٠) هەرئەوبەڵگەی سەروو•لاپەرەی ٣٣ ، دێڕی ٢٢٠

١١) قــۆچەقا نــی : بەزما نی فا رسی ـ فَلا خن ـ ی پێ ـی دەڵێن ، قا یشێکە لە نێوا ن دودەسکی لەخوری یا گشتەك چندرا ـ ودا یــە • خرکەبەرد لە نێــو قا یشەکەی دەندرێ وبەدەوری سەر دا زۆر بەتوندی دەسورێندرێ ، جورێکی کە وە وزەوز دەکەوێ • کا تێك وەسەربا و دەکەوێ ، لەنا کا و دەسکێکی بەردەدرێ • بەردەکە بەفرکەفرك بۆلای نیشا نە دەڕوا •(بەقۆچەقا نــــی قەڵماسن ، قەڵماسە، قەڵماسەنگیش دەکوترێ ، فەرهەنگــی خاڵ ) هەروەك مێژو بەرچا ودەخا ، نەك هەر ئەو سەردەمــی ، دەتوا نین بلێین پێش ئەوەی کــە چەکی گەرم وئا ورین با وبێ وبرەوی هەبێ ، کوردا ن قۆچەقا نیا ن هەربەکا رهێنا وەو ئە ـ نگێوەی چاك بون • بۆ وێنە کا رە سا تی خوا رێ دەخەمـــــە بەر چا و :

سەفەوییەکا ن لە شەڕێکی قورس دا کەلەگەڵ تورکەکا نــــی عوسما نی کردویا نە، سەبا رەت بەوەی کە هێشتا هەر چــەکی سا رد با وبووە ،قۆچەقا نیا ن وەکا رخستووە• کوردا نیش قۆ ـ چەقا نی وەشێنی هەڵکەوتویا ن هەبووە ولەو شەڕەی دا دژ ی تورکەکا نی عوسما نی بەشدا ربوون ـ پێش شەڕی قەڵای دمدم ـ بە تا یبەت پا ڵەوا نێکی بەدەست وبردونەبەزمخەڵکی با نــە بەنێوی سا رۆبیرە سەر کردا یەتی پۆلی قۆچەقا نی وەشێنا نی بەدەستەوە گرتوە وکۆڵنەدەرا نە بەرەنگا ری تورکەکا نــی

عوسما نی بووه، ڕا وی نا ون وتێکی شکا ندون .( جنگهـــا ی صفویّه با ترکا ن عثما نی ، ترجمه‌ٔ ذبیح اللّه منصـــــــوری )

شەڕ بە قۆچەقا نی لە چەند جێی کتێبی شەرەفنا مەی شەرەفخا نی بدلیسی ی دا بەرچا و دەکەوێ . بەڵام لەو سەرچا وەی دا ، بە جێی قۆچەقا نی ، جا روبا روشەی بەرەقا نی یا ن قەڵما ـ سك بەکا ر هێنرا وە . ( بڕوا ننە : شرفنا مەی شرفخا نی بدلیسی، هەژا ر، ١٩٨١ چا پی دو هەمین ، ل ٨١٦) .

(١٢) پیتـی بـــــــزوێـن (= دەنگی بزوێن = بزوێـن ) بەغەرەبی پێی دەڵێن : حروف مصوّت وبە فا رسی ، حـــروف صدا دا رکـە بەرا مبەرەکا نیا ن دەبنە: حروف‌صا مت ، حـــروف بی صدا . لە زما نی کوردی دا هێندێك لە نوسەرووێژەوا نەکا ـ نما ن پێیا ن دەڵێن : پیتـی دەنگدا ر(وەك ما مۆستا ما رفـــی خەزنەدا ر، کێش وقا فیە،ل ٤) و هێندێکیشیا ن پێی دە ڵێـــن دەنگ‌بزوێـن یا ن پیتـی بزوێن یا ن بزوێـن (وەك : ما مۆســتا ئا ورەحما نی حاجی ما رف و ما مۆستا عەبدوررەحما نی زەبیحـــی، قا موسی زما نی کوردی ، بەرگی یەکەم، ١٩٧٧ زا ینی، چا پخا ـ نەی کۆڕی زا نیا ری کورد، بەغدا ،ل ٦٥ ، ما مۆستا تەوفیـــــق وەهبی بەگ، دەستوری زما نی کوردی ، جزمی یەکەم، بەغـدا ،١٩٢٩، ل ١٠) .

من «بزوێـن م پێ با شترولێـها توترە بۆئەومەبەستـــــە .

یان چاکتربڵێم : ئەوەم زۆرتر وەبەر دڵی دەکەوێ .
لەبەرئەوەی کە هەمو پیتێك دەنگی هەیە ودروست نییە
پیتەکانی کوردی بەدوبەشی دەنگدا روبێ بەنگەدا بەش کەین .
چاکترئەوەیە پیتەکان بەدوبەشی : بزوێن و نەبزو نێو
ببەین . بەگوێرەی دوایین لێکوڵینەوەوپشکنینەوەی تێکرایی
بۆزمانی کوردی حەوت بزوێن وەدی هاتوون کە ئەوانەن :
ە دوجورە ئا ـ ا وەك : ئاو ـ با . ە سێ جورە :
ئە ،ـە ، ە وەك : ئەوە ، بابە ، وەرە . ێ کە چوار جورە :
ئێـ ، یـ ، ێ ، ئێ ، وەك : ئێران ، دێم ، دێ ، ئێ ئێ !
î کە چوار جورە : ئیـ ، یـ ، ی ، ئی ـ وەك : ئیدی ـ
سیروان ـ ئی منە . o دو جورە : ئۆ ، ۆ ـ وەك :
ئۆخەی ـ سۆران ـ . u جورێکە و ـ وەك : کورد .
û دوجورە وەك : ئومێد ، سور . ئو ، و .
١٣) پاشبەند : کەرتی بچکۆلەن ، خۆیان بە تەنیایی
هیچ مانایان نییە ودەچنە بنی وشەیەوەومەدلولێکی نوێ
لە ماناکەیان زیاد دەکەن .(قاموسی زمانی کوردی ، بەرگی
یەکەم ، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٧ ل ٩٨)
هێندێك لەو پاشبەندانە ، ئەوانەن :
ئاڵ ـ وەك : قرژ+ ئاڵ = قرژاڵ ، فیش + ئاڵ = فیشاڵ
ئان ـ وەك : بەهار+ ئان = بەهاران ، بەیان +ئان = بەیانان

ئاو ـ وەك: خور+ ئاو= خوراو، سوت+ئاو = سوتاو

ئاوی ـ وەك :قوڕ+ ئاوی = قوڕاوی ،خوێن +ئاوی = خوێناوی

ئایەتی ـ وەك : تینو+ ئایەتی = تینوایەتی ،

برسی + ئایەتی = برسیایەتی .

ئك ـ وەك : دەس + ئك = دەسك ،ئەنگوت + ئك = ئەنگوتك

ئن ـ وەك : لیك + ئن = لیکن ،نەوس+ ئن = نەوسن

ئندە ـ وەك : باڵ + ئندە= باڵندە،دڕ+ ئندە = دڕندە

ئۆك ـ وەك : سەر+ ئۆك = سەرۆك ،بن +ئۆك = بنۆك

ئۆکە ـ وەك : باڕ+ ئۆکە= باڕۆکە ،جند+ ئۆکە= جندۆکە

ئۆلکە ،وەك : مێت+ ئۆلکە= مێتۆلکە

مێرو + ئۆلکە = مێروولکە .

ئۆلە ،وەك : مێش+ ئۆلە = مێشۆلە، مێرو+ ئۆلە= مێرۆولە

ئەکە ،وەك : دار+ ئەکە= دارەکە ،شوان +ئەکە= شوانەکە

ئەڵوکە، وەك : سێو+ ئەڵوکە = سێوەڵوکە

دێو + ئەڵوکە = دێوەڵوکە .

ئیلانە، وەك : ورد+ ئیلانە= وردیلانە،قنج + ئیلانە= قنجیلانە

ئەوە، وەك : خوێندن + ئەوە = خوێندنەوە

سوڕان + ئەوە = سوڕانەوە .

بۆوە ـ وەك : زەرد+ بۆوە= زەردبووە،سور+ بۆوە= سوربۆوە

بێن ـ وەك : دەم+ بێن = دەمبێن ،باقە+ بێن = باقەبێن

کە، وەك : وەر+ گێڕ+ کە= وەرگێڕکە،
پێ + ڕۆ + کە = پێ ڕۆکە .
ڵۆك ـ وەك ١: سپی + ڵۆك = سپیلۆك ،تەپە+ ڵۆك = تەپەڵۆك
ڵە ـ وەك : کوپە+ ڵە= کوپەڵە،گۆزە+ ڵە = گۆزەڵە
ەگەل ـ وەك : کوڕ+ ەگەل = کوڕەگەل ،
کەر + ەگەل = کەرەگەل .
ەلان ـ وەك : بەرد+ ەلان = بەردەلان ،خیز+ەلان = خیزەلان
ێلە ـ وەك : ئەحمەد+ ێلە= ئەحمەدێلە، سیامەند+ێلە =
سیامەندێلە .
ێلێ ـ وەك : خەج + ێلێ = خەجێلێ ،ئەستی+ێلێ= ئەستیێلێ
ێنگ ـ وەك : قوڵ+ ێنگ= قوڵێنگ ،بێژ+ ینگ = بێژێنگ
یینە، وەك : برا + یینە= برایینە،خزم+ یینە= خزمیینە
١٤)وێرای ئەووێنانە کەبەڕێز تەوفیق وەهبی،هێناونی
دەتوانین چەند وشەیەکی دیکەش بەرچاو خەین . وەکو:
هەنگ ـ هەنگوین ـ . دڵداری شاعیر دەڵێ :
تێ کۆشەدا ییم، هەروەکوهەنگ بە!
لەمەیدا تی ژین،ئا ما دەی جەنگ بە!
(بڕوانن: بەرگی دووەمی شیعروئەدەبیاتی کوردی ، ڕەفیق حیلمی ، چاپخانەی الشباب ،بەغدا ١٩٥٦، زاینی، ل ١٩).
لەشێوەی بادینانیش دا وشەیەکی دەهێنمە بەرچاو :

بسرمقبرباف برن هەنگی مریدو ذاکرن
حمیان لوی دعاکرن وان چارکنار گنبتی

(بڕواننە: چیرۆکی شێخی سەنعان کەم مب • ڕودێنکو وەری - گێڕا وەتەسەر ڕوسی• وەرگێڕئەووشەی"لەودەمەدا "وەرگێڕا وە • مەسکەو، ١٩٦٥زایینی ، ل ٩٠ ، بەندی ١٠٢) •

هەروەها وشەی هەنگا وبەمانای لۆقاو ئەومەبەستەی دەگرێتە- وە و بۆئەوەی دەبێ ، بۆوێنەدیاری کەین • هەروەها هەنگل ، ئەوجاریاسی " گمەتا " یان " گمەت " بکەین : گماندن بە مانای خوێندنی کۆترە• وەکو دە کوترێ : ئەوکۆترە دەگمێنێ یان گمگم کردن بە مانای گڕوگاڵی منداڵی (جزمی سێهەم لە فەرهەنگی خاڵ، ١٩٧٦ زاینی) یان :

•••مەمکت شەمامەی گمگمە خڕوپڕی نێو دەستمە
زەردوسورلەگوێن ڕەنگمە "فۆلکلۆر"

١٥) بڕواننە: ژمارە٢ لە " بەشی لەسەر وشەڕۆیشتن" خاستی ١٠ کە دەگەڕێتەوە سەر شوێنەوارەکانی ژابا•

## « پێرستی نێوی مرۆڤ »

---

« پێرستی نێوی کتێبەکان »

---

«پێرستی نێوی شوێنەکان»